زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ منداڵان



# سەگی پیاوانی ئەشکەوت


هۆنراوەی: مەرسووم گەشبین

نیگار: دارا محەمەد عەلی








١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

زنجیرەی چیرۆکی گیانلەبەران لە قورئانی پیرۆزدا بۆ مندالان



# سەگی پیاوانی ئەشکەوت

هۆنراوەی : مەرسوم گەشبین
نیگار : دارا محەمەد عەلی


التفسیر
هەولێر/ شەقامی دادگا ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨
مۆبایل : ٠٧٧٠١٣٨٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com. - altafseer@hotmail.com.

ناویناميلكە: سەگی پياوانی ئەشكەوت
هـۆنـــراوەی : مەرسوم گەشبين
بلاّوكردنەوەی: نووسينگەی تەفسير
نيـگـــــــار : دارا محەمەد عەلی
ســـالّی چـاپ : ١٤٢٦ك – ٢٠٠٥ز
نـۆرەی چـاپ : يەكەم
تـيـــــــراژ : ٤٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٣٧ ساڵی ٢٠٠٣

سەگ گیاندارێ هۆشیارە
پاسەوانی شەوگارە
هەموو کاتێ بێدارە
لە دێهات و لە شارە
لەپێش دەرگا و لە نێو ڕان
هاوڕێیە لەگەڵ شوان
لە دەشت و دەر و کوێستان
چاوبازە وەک نیگابان

هەردەم لەگەڵ ئینسانە
هۆشیارترین حەیوانە
بە وەفا و بە ئاگایە
لەکاری شارەزایە



سەگ لەنێو مێژووی دێرین
لە گێتی پان و بەرین
لەنێو پەرتوک و ئایین
گوێگرە و رازی و ئەمین
هەستەکانی زۆر تیژە
وریا و نەفەس درێژە
دەکەوێتە شوێنی بۆن
ئەگەر نوێ بێ و ئەگەر کۆن
بۆنی هەر شتێ بکات
لەژێر ئەرز دەری دەکات




سەگ بە بەهرە و زانایە
زۆر بە هەست و توانایە
لەم سەردەمە جەنجاڵە
لەدوای ئەم هەموو ساڵە
سەگ لەگەڵ مرۆ دایە
ئافەریدەی خودایە

مافی ئاسایی خۆیە
مافێکی هەبێ بۆیە
ئەویش زوڵمی لێکراوە
بەناحەق سەر براوە
لەپاش ئەم هەموو چاکە
لەم جیهانە بێباکە
سەگ وا خۆی دەناسێنێ
هێز و توانای دەنوێنێ

لەگشت گۆشە و کنارێ
لەگشت پایتەخت و شارێ
لەسەری هەر دیوارێ
لە باخچە و گشت حەسارێ
کار و پۆستی پێ دراوە
پلە بەندی کراوە
لە ئیشی زۆر زۆر گرنگ
لەنێو گۆرەپانی جەنگ
گیان باز و هەڵمەت بەرە
ئامادە و خۆ بەخت کەرە
سەگی پۆلیسی و سەرباز
بەمەشقی ئاشکرا و ڕاز
لە گۆرەپانی نەبەرد
وەک سەربازی کێو و هەرد
سەگی پۆلیسی ناو شار
خاوەن پۆست و هەزار کار

بۆ گەڕان بەدووی فیرار
پیاوی دز و تاوان بار
بۆ چاکە و ڕزگار کردن
بۆ نەجات دان لە مردن
بۆ سەر کار و بۆ بازاڕ
سەد جۆر سەگی خاوەن کار





سەگ بە حەپەحەپ ووتی:
لەم سەردەمە و لەم دەورە
بتیان بە خوا دەزانی
بە کوشتن و بە ڕاونان
ڕاو دەنراین و دەردەکراین
لەژێر فشار و ستەم
پەنا و جێگامان نەبوو
لەترس پیاوە گەورەکان
هەڵدەهاتین دەترساین
ئۆقرەمان لێ بڕابوو

سەردەمی بت پەرەستی
پیاوی زۆر گەورە گەورە
سەگ دەبووە قوربانی
بە تیر و تەور و کەوان
بێ جێی و دەربەدەر دەکراین
ژینمان لەگەڵ ژان و خەم
گیانمان هی خۆمان نەبوو
ڕژێمە زۆردارەکان
لە جێگایەک نە دەماین
ئاسایشمان نەما بوو



پیاوێ چاك و بە ئیمان    زۆر دڵسۆز و میهرەبان
مەری دێی دەڵەوەران    شوان بوو لە دەشت و بان
سەگێکی زۆر لەدەور بوو    لەگەڵ راندا دەردەچوو
من لەگەڵ ئەو شوانە    خوا ناس و بە ئیمانە
خودای یەکتای دەپەرەست    ڕقی بوو لە بت پەرەست

چۆن بت پەرەستی بێ دین    بە دڵ رەشی و ڕق و قین
لەنێو شار و لە نێو دێ    سەگیان بهاتبایە ڕێ
بێبەزەیی دەست بەجێ    بێئەوەی یاسایەك بێ
بێ کەس و بێ فریا رەس    گیانمان خستبووە نێو دەس

من سەگی نێوی ڕان بووم
شوانی دڵ نەرم و چاك
لە نێوی دێ )ڕەقیم( بووین
ڕانمان دەبردە لەوەڕ
لە هاوین و لە زستان
لە بەهار و پایزان

لەگەڵ شوان دەردەچووم
خوا ناس و بە ڕەحم و پاك
بۆ دەشت ودەر دەردەچووین
لەبەر خۆر و ژێر سێبەر
لە گەرما و بەفر و باران
لە کاتی گەڵا ڕێزان



دەچووینە کێوێکی بەرز
بەرزتر لە دەڕیا و لە ئەرز
لەسەر سنگی ئەو کێوە
ئەشکەوتێ لەنێو دێوە
دەبینرا و دیار بوو
چواردەوری بەرد و دار بوو
ڕانمان دەبرد بۆ ئەوێ
دەمان لەوەڕاند لەوێ


الله
جار بە جار شوانەکە
دوور دەکەوت لە ڕانەکە
هەڵدەکشا بۆ ئەشکەوت
منیش جارێ بە ڕێککەوت
شوانەکەم لە ئەشکەوت دی
لەگەڵ چەند لاوێکی دی
لەسەر سوجدە وەچۆک وا
دەپاڕانەوە لە خوا


بۆیە منیش مامەوە
لەوێ نەجوڵامەوە
لەبەردەم ئەو ئەشکەوتە
بڕیارم دا ئەو وەختە
لەوێ بمێنمەوە
بۆ لای ران، نەچمەوە

مامەوە لەنێو ئەشکەوت
ئەوان دەپاڕانەوە
زانیم لە دەست ستەم کار
منیش لە دەستی زۆردار
کەم کەم پیاوەکان خەوتن

من یەکێک و ئەوان حەوت
بە گریە و لاوانەوە
هەڵاتوون لە نێو شار
بە قین بووم و بێ قەرار
درێژ بوون و پاڵ کەوتن



بۆم دەرکەوت ئاسایی نیم لەنێو ئەشکەوت لەسەر پێم
راکشام و بخەوم خەوم دەهات و خەوم
ئێتر کاتێ کە هەستام لەسەر دەست و پێ وەستام
زۆر لە خۆم سەرسورما بووم چۆن بە شەو بێ ئاگا بووم





زوو بۆم دەرکەوت پیاوەکان
لەجێگای خۆی نەماوە
سێ سەد و نۆ ساڵ لە خەو
بە فرمانی خوا نووستین

ووتیان: دەشت و ڕێگا و بان
ڕێگا و بان گشت گۆڕاوە
لە ئەشکەوت بەڕۆژ و شەو
پارێزراو بێ وەی بووین

